| ئایەت | ووشە | ڕاڤــــە |
|---|---|---|
| 17 | طَغَىٰ | یاخی بوو و سەرکەش و لەسنوور دەرچوو . |
| 18 | تَزَكَّىٰ | پاك ببێتەوەو پوخت بێت . |
| 20 | ٱلْآيَةَ ٱلْكُبْرَىٰ | نیشانەو بەڵگەی هەرەگەورە ( کە موعجیزەی دار عەساکەو دەستی سپی پرشنگدار بوو ). |
| 22 | يَسْعَىٰ | هەوڵی دا ، هەوڵ و تێکۆشانی دا . |
| 23 | فَحَشَرَ | کۆی کردەوە . |
| 25 | نَكَالَ | سزا ، تۆڵە . |
| 26 | لَعِبْرَةً | پەند و ئامۆژگاری . |
| 27 | أَشَدُّ | گرانترە ، گەورەترە ، مەزنترە . |
| 28 | سَمْكَهَا | بەرزی و بڵندیەکەی . |
|  | فَسَوَّىٰهَا | ڕێکی خستووە ، ڕێك و پێکی کردووە . |
| 29 | وَأَغْطَشَ | تاریکی داهێناوە ، تاریکی کردووە . |
|  | وَأَخْرَجَ | دەری خستووە . |
| 30 | دَحَىٰهَآ | ڕای خستووە و تەختی کردووە . |
| 31 | وَمَرْعَىٰهَا | لەوەڕگا ، شوێنی خۆراك پەیداکردن بۆ مرۆڤ و گیانلەبەران . |
| 32 | أَرْسَىٰهَا | پتەو دامەزراندووە ، بە تۆکمەیی دایمەزراندووە . |
| 34 | ٱلطَّآمَّةُ | کارەساتی هەرە گەورە بەڵای گەورەو سامناك (مەبەست پێ ڕۆژی دواییە) ئەوەی هەموو شتێك دادەپۆشێت. |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاقــە |
|---|---|---|
| 36 | وَبُرِّزَتِ | دەرکەوت ، پشاندرا . |
| 39 | ٱلْمَأْوَىٰ | شوێن و جێگای گەڕانەوەو مانەوە، مەنزڵگا. |
| 42 | مُرْسَىٰهَا | کاتی هاتنە کایەوەو چەسپانی ، کاتی بەرپابوونی . |
| 44 | مُنتَهَىٰهَآ | سەرەنجام و گەڕانەوەی . |
| 46 | عَشِيَّةً | ئێوارە ، سەر لە ئێوارە . |

## سـورة عبس

| ئایەت | ووشە | ڕاقــە |
|---|---|---|
| 1 | عَبَسَ | ڕووی گرژبوو نێوچاوانی هاتەوە یەك . |
| | وَتَوَلَّىٰٓ | ڕووی لێ وەرگێراو پشتی تێکرد . |
| 3 | يَزَّكَّىٰٓ | پاك ببێتەوە ، خاوێن ببێتەوە . |
| 4 | يَذَّكَّرُ | ئامۆژگاری وەربگرێت . |
| 5 | ٱسْتَغْنَىٰ | بێ نیازی، سەر بڵندی خۆی نیشاندا لە وەرنەگرتنی باوەڕ لەبەر پارەو ماڵ و سامان . |
| 6 | لَهُۥ تَصَدَّىٰ | تۆ ڕووی تێدەکەیت و گوێ بۆ ووتەکانی دەگریت . |
| 8 | يَسْعَىٰ | بە پەلەدێت، بە پەلە ڕادەکات بۆ لات . |
| 10 | عَنْهُ تَلَهَّىٰ | تۆ خۆتی لێ بێ ئاگادەکەیت و پشتی تێدەکەیت و خۆت بە شتی تر سەرقاڵ دەکەیت . |
| 11 | تَذْكِرَةٌ | یاد خستنەوە و ئامۆژگاری . |
| 13 | صُحُفٍ | لاپەڕەی نووسراو . |
| | مُّكَرَّمَةٍ | بەرز و بەڕێزن لای خوا . |
| 14 | مَّرْفُوعَةٍ | پلە بەرز و پایە بڵند . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|
| 15 | سَفَرَةٍ | ئەو فریشتانەن کە کردەوەی مرۆڤەکان دەنووسنەوە و تۆماردەکەن . |
| 16 | كِرَامٍ | پایە بەرز و ڕێزدار . |
| | بَرَرَةٍ | ڕاستگۆو گوێڕایەڵ،خواناس فەرمان بەردارن |
| 17 | قُتِلَ | نەفرەتی لێبێت ، لەعنەتی لێبێت . |
| 17 | مَآ أَكْفَرَهُۥ | چەندە کافر و بێ بڕوایە ، چی وای لێکردووە کافرو بێبڕوابێت. |
| 19 | فَقَدَّرَهُۥ | ئەندازەی بۆ کێشاوەو ڕێکی خستوە . |
| 20 | يَسَّرَهُۥ | ئاسان کراوە . |
| 21 | فَأَقْبَرَهُۥ | گۆڕی بۆدروست کردوە،فەرمانی داوە بخرێتەگۆڕەوە |
| 22 | أَنشَرَهُۥ | زیندووی دەکاتەوە . |
| 23 | لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ | ئەوەی فەرمانی پێکراوە بە جێی نەگەیاندووەو کەمتەرخەمی تێدا کردووە . |
| 23 | قَتَرَةٌ | داڕژاندن ، داباراین . |
| 26 | شَقَقْنَا | لەت لەتمان کردووە بە ڕووەك و گژوگیا . |
| 27 | حَبًّا | دانەوێڵە . |
| 28 | وَقَضْبًا | سەوزەو گژو گیا، ئەو ڕووەکانەی کە بەرهەمەکانیان لێدەکرێتەوەو دووبارە گەشە دەکەنەوەو بەرهەم دەدەن . |
| 31 | وَأَبًّا | لەوەڕ و گژو گیا، دارخورما . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 33 | ٱلصَّآخَّةُ | دەنگی بەهێزی گویێ کەرکەر، ناوێکەلە ناوەکانی ڕۆژی دوایی . |
| 34 | يَفِرُّ | ڕادەکات ، هەڵدێت . |
| 37 | شَأْنٌ | کێشە ، کار. |
| 38 | مُّسْفِرَةٌ | گەش و جوان و ڕووناك ، شاد و پڕشنگدار . |
| 39 | مُّسْتَبْشِرَةٌ | مژدەدەرو شادمان . |
| 40 | غَبَرَةٌ | تەپ تۆز ، تۆز و گرژ و تاڵ . |
| 41 | قَتَرَةٌ | ڕەش و تاریکی . |

## سـورة التكوير

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 1 | كُوِّرَتْ | پێچرایەوەو ڕووناکی نەما . |
| 2 | ٱنكَدَرَتْ | هەڵوەرین و کەوتنەخوارەوەو پەرش و بلاّوبوون . |
| 3 | سُيِّرَتْ | لە شوێنی خۆی خزێندرا ، لادرا . |
| 4 | ٱلْعِشَارُ | ووشتری ئاوسی (10) مانگی . |
| | عُطِّلَتْ | وازیان لێهێنراو بێ شوان بوون . |
| 5 | ٱلْوُحُوشُ | گیانەوەرەکان، ڕوح لەبەرەکان جگە لەمرۆڤ |
| | حُشِرَتْ | کۆکرانەوە . |
| 6 | سُجِّرَتْ | هەڵگیسێنران و تەقینەوە ، گڕیان گرت و سووتان . |
| 7 | زُوِّجَتْ | جووتکرایەوە ( ڕووح لاشە جووت کرانەوە). |
| 8 | ٱلْمَوْءُۥدَةُ | کچانی زیندە بە چاڵکراو . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 10 | ٱلصُّحُفُ | نامەو پەڕاوی کردەوەکان . |
| | نُشِرَتۡ | بلاّوکرایەوەو دابەشکرا . |
| 11 | كُشِطَتۡ | داماڵێنراو پێچرایەوە ، هەڵکێشراو لادرا . |
| 12 | ٱلۡجَحِيمُ | دۆزەخ ، جەهەننەم . |
| | سُعِّرَتۡ | هەڵگیسێنراو گڕی گرت. |
| 13 | أُزۡلِفَتۡ | نزیك کرایەوەو هێنرایە پێش . |
| 14 | مَّآ أَحۡضَرَتۡ | چی ئامادە کردووە لە چاکەو خراپە . |
| 15 | بِٱلۡخُنَّسِ | ئەستێرە گەڕۆکەکان، کە بەڕۆژ پەنادەگرن و دیار نامێنن پاشان بەشەو ڕووناکیان دردەکەوێتەوە . |
| 16 | ٱلۡجَوَارِ | گەڕۆك ، ڕۆیشتوو ، سوڕاو . |
| | ٱلۡكُنَّسِ | خۆشاراوەکان ، دیار نەماوەکان بە ڕۆژ . |
| 17 | عَسۡعَسَ | تاریکی داهات ، تاریکی نەما . |
| 18 | تَنَفَّسَ | هەناسەی داو بەرەبەیان داهات . |
| 19 | لَقَوۡلُ رَسُولٖ | ووتەی نێردراوێکە کە(جوبرائیل)ە علیەالسلام |
| 20 | مَكِينٖ | خاوەن پلەو پایەکی بەرز و بڵندە . |
| 21 | مُّطَاعٖ | گوێڕایەڵکراو . |
| 23 | رَءَاهُ | پێغەمبەر جوبریلی بینی لەسەر شێوەی خۆی . |
| 24 | ٱلۡغَيۡبِ | وەحی، سروش و هەواڵی ئاسمان، نهێنی و پەنهانی |
| | بِضَنِينٖ | ڕژدی و چرووکی ناکات ، نای شارێتەوەو چروکی پێناکات . |

منتدى إقرأ الثقافي

## سـورة الإنفطار

| ئایەت | ووشە | راڤــــە |
|---|---|---|
| 1 | انفَطَرَتۡ | لەت لەت بوو ، پارچە پارچە بوو . |
| 2 | ٱلۡكَوَاكِبُ | ئەستێرەکان ، هەسارەکان . |
| | انتَثَرَتۡ | کەوتنە خوارەوە، پەرش و بڵاوبوون بەجیا جیا کەوتنە خوارەوە . |
| 3 | فُجِّرَتۡ | تێکەڵ بوون و بوون بە یەك دەریا . |
| 4 | بُعۡثِرَتۡ | ژێرەو ژووربوون ، قەڵب بوونەوەی ئەوەی ناو سکی هاتیتە دەرەوە . |
| 6 | غَرَّكَ | هەڵی خەڵەتاندووی ، فریوی دای . |
| 7 | فَسَوَّىٰكَ | ئەندامەکانی ساغ و سەلامەت کردووی. |
| | فَعَدَلَكَ | بالآی جوان کردووی و مام ناوەندی خەڵکی کردووی، یان لای داوی بۆشێوەیەك کەخۆی ویستویەتی جا چ جوان بیت یان ناشرین، درێژ یان کورت ... |
| 8 | رَكَّبَكَ | یەکی خستووی ، رێکی خستووی . |
| 9 | بِٱلدِّينِ | رۆژی دوایی ، رۆژی زیندووبونەوە ، رۆژی پاداشت وەرگرتنەوە. |
| 13 | ٱلۡأَبۡرَارَ | چاکەکاران و راستگۆیان لەبروا هێنانیان . |
| 14 | ٱلۡفُجَّارَ | بەدکاران ، خراپە کاران . |
| 15 | يَصۡلَوۡنَهَا | دەچنە ناوی ، گەرمیەکەی دەچێژن . |
| 16 | وَمَا هُمۡ عَنۡهَا بِغَآئِبِينَ | لێی دەرناچن . |
| 19 | لَا تَمۡلِكُ | هیچی بە دەست نییە، هیچ شتێکی لەدەست نایەت |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| | | **ســورة المطففين** |
| 1 | وَيۡلٞ | سزاو ئازار ، تیاچوون ، دۆڵێکە لە دۆزەخ . |
| | لِّلۡمُطَفِّفِينَ | بۆ ئەوانەی لەکێشان و پێواندا لەتەرازو فێڵ دەکەن، تەرازووبازی دەکەن، لە کێشان وپێوانە کردندا شتێکی کەم دەکەن و شتێکی کەم دەدزن و فێڵی تێدا دەکەن |
| 2 | ٱكۡتَالُواْ | پێوانە بۆخۆیان بکەن و شت لەخەڵکی بکڕن . |
| | يَسۡتَوۡفُونَ | بە تەواوی و بە زیادەوە لێیان دەکڕن . |
| 3 | كَالُوهُمۡ | بۆ خەڵکی پێوانە بکەن و بفرۆشنە خەڵکی . |
| | وَّزَنُوهُمۡ | بۆ خەڵکی تر بکێشن و بیانفرۆشن . |
| | يُخۡسِرُونَ | کەم و کورتی تێدا دەکەن ، کەمیان دەدەنێ و فێڵیان لێدەکەن . |
| 7 | كِتَٰبَ ٱلۡفُجَّارِ | نامەو کردەوە نوسراوەکانی تاوانباران . |
| | سِجِّينٖ | تۆماری شەڕ و خراپە لە هەرە ژێرەوەدایە . |
| 9 | مَّرۡقُومٞ | نوسراوەتەوە ، مۆرکراوە و نیشانە کراوە . |
| 12 | مُعۡتَدٍ | ستەمکار و سنور بەزێن لە ڕێگای ڕاست . |
| | أَثِيمٍ | تاوانبارو زۆر خراپە کار . |
| 13 | أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ | قسەو چیرۆك و ئەفسانەی پێشینان . |
| 14 | رَانَ | دایپۆشیوەو پەردەی هێناوە بەسەردا ، خەتم و مۆری لەسەرداوە . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
| --- | --- | --- |
| 15 | لَّمَحْجُوبُونَ | بەربەست هەیە لە نێوانیان و بێ بەش دەکرێن. |
| 16 | لَصَالُوا۟ | دەچنە ناوی ، دەخرێنە ناوی . |
| 18 | كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ | تۆمار و نوسراوی کردەوەی چاکەکاران . |
|  | عِلِّيِّينَ | تۆماری چاکەو خێر ، بەرز و بڵند و هەرە سەرەوە . |
| 21 | ٱلْمُقَرَّبُونَ | ئەو فریشتانەی نزیکن لای خوا . |
| 23 | ٱلْأَرَآئِكِ | تەخت، کورسی، قەنەفەکان . |
| 24 | نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ | جوانی و گەشاوەیی و بریقەی خۆشگوزەرانی و نازونیعمەت . |
| 25 | رَّحِيقٍ | شەرابی پاك ، باشترین جۆری شەراب . |
| 25 | مَّخْتُومٍ | سەربە مۆرو نەکراوە . |
| 26 | خِتَٰمُهُۥ | دوا قومی ، کۆتاییەکەی . |
|  | مِسْكٌ | مسك ، بۆنی مسك . |
|  | فَلْيَتَنَافَسِ | با پێشبڕکێ بکەن، با پەلە بکەن . |
| 27 | وَمِزَاجُهُۥ | تێکەڵکراوەکەی ، ئاوێتەکەی . |
|  | تَسْنِيمٍ | ئاوی کانیەکی بەرزە ، خواردنەوەکەی باشترین خواردنەوەیە . |
| 28 | يَشْرَبُ بِهَا | لێی دەخۆنەوە . |
| 29 | أَجْرَمُوا۟ | بەدکاران ، ئەوانەی کردەوەی خراپیان کردووە . |
| 30 | يَتَغَامَزُونَ | بە چاو هەڵتەکاندن ئاماژەیان بۆ دەکردن بە گاڵتەپێکردن، چاویان لێدادەگرتن بە گاڵتەکردن. |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|
| 31 | فَكِهِينَ | بە پێکەنین و گاڵتەجاری، بەدەم پێکەنین و بە پێ خۆشبوون باسیان دەکردن . |
| 36 | ثُوِّبَ | پاداشتیان دراوە ، جەزایان دراوە . |

## سـورة الإنشقاق

| ئایەت | ووشە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|
| 1 | انشَقَّتْ | لەت بوو ، لەت و پەت بوو . |
| 2 | وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا | مل کەچی و گوێڕایەڵی پەروەردگاری کرد . |
| | وَحُقَّتْ | دەبێ و پێویستە لەسەری واش بێت . |
| 3 | مُدَّتْ | ڕاکێشراو پانکرایەوە . |
| 4 | وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا | ئەوەی تیای بوو فڕێی دایە دەرەوە (لەمردووەکان) |
| | وَتَخَلَّتْ | خاڵی بوو هیچی تیا نەما . |
| 6 | كَادِحٌ | زۆر ماندوو ، کرێکاری ماندوو ، کارکەر بەوپەڕی تواناو هێزەوە . |
| | فَمُلَٰقِيهِ | هەرپێی دەگەیت و دەگەڕێیەوە لای . |
| 9 | وَيَنقَلِبُ | دەگەڕێیتەوە بۆ لای . |
| | مَسْرُورًا | بە دڵخۆشی و ڕووخۆشی . |
| 11 | ثُبُورًا | مردن و لەناوچوون ، مەرگ و مردن . |
| 12 | وَيَصْلَىٰ | دەخرێتە ناوی ، دەچێژێت . |
| | سَعِيرًا | ئاگری دۆزەخی گڕگرتوو . |
| 14 | يَحُورَ | دەگەڕێتەوە، گەڕانەوە بۆ کەمی دوای زیادبوون . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|
| 16 | فَلَآ أُقۡسِمُ | سوێند دەخۆم . |
| | بِٱلشَّفَقِ | سووری کەناری ئاسمان دوای خۆر ئاوابوون |
| 17 | وَسَقَ | کۆی کردەوەو خڕی کردەوە ، کۆی دەکاتەوە و دەگرێتە خۆی . |
| 18 | ٱتَّسَقَ | کۆبوویەوەو تەواوبوو، پڕ بوویەوەو ڕووناکیەکەی تەواوبوو . |
| 19 | لَتَرۡكَبُنَّ | تێدەپەڕن و پێی دەگەن . |
| | طَبَقًا | حاڵەت لە دوای حاڵەت ، یەکسان لە ناخۆشی دا . |
| 23 | يُوعُونَ | لە دڵدا هەڵی دەگرن و دەی شارنەوە . |
| 25 | غَيۡرُ مَمۡنُونِۭ | نەبڕاوەو بێکۆتایی . |

## سـورة البروج

| ئایەت | ووشە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|
| 1 | ٱلۡبُرُوجِ | شوێنەکانی خۆر و مانگ ، ئەستێرەو هەسارەکان، خولگەکان، شوێنی بەرز . |
| 2 | وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡمَوۡعُودِ | ڕۆژی بەڵێن پێدراو (ڕۆژی قیامەت) . |
| 3 | وَشَاهِدٍ | شایەتی دەر (بینەر) . |
| | وَمَشۡهُودٍ | ئەوەی شایەتی لەسەر دەدرێت . |
| 4 | قُتِلَ | لەعنەتی لێکرا ، نەفرەتی لێکرا . |
| | ٱلۡأُخۡدُودِ | چاڵی گەورە لەناو زەوی وەکو خەندەق . |
| 5 | ٱلۡوَقُودِ | سووتەمەنی ، بڵێسەو داگیرساو . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشـە | راقــــە |
|---|---|---|
| 6 | قُعُودٌ | دانیشتوان ، دانیشتوو . |
| 8 | وَمَا نَقَمُوا | هیچ عەیبێکیان لێنەگرتن ونکۆڵیان لێنەکردن |
| 10 | فَتَنُوا | سزایان دان ، سوتاندیان . |
| | الْحَرِيقِ | سوتێنەر . |
| 12 | بَطْشَ | دەست وەشاندن ، گرتنی توندو تۆڵە سەندنەوە . |
| 13 | يُبْدِئُ | لەسەرەتاوە دروستی دەکات . |
| | وَيُعِيدُ | دەیگەڕێنێتەوەو زیندوی دەکاتەوە . |
| 14 | الْوَدُودُ | میهرەبان و بە سۆز ، دلۆڤان و خاوەن سۆز |
| 15 | الْمَجِيدُ | بەرز و بڵند و پایەدار . |
| 20 | مُحِيطٌ | دەورەی داون و لە دەستی دەرناچن . |

## ســورة الطارق

| ئایەت | ووشـە | راقــــە |
|---|---|---|
| 1 | وَالطَّارِقِ | ئەوئەستێرەی کەوا لەشەودا دەردەکەوێت، بەهەموو شتێك دەوترێ کە لە شەودا دەردەکەوێ. |
| 3 | النَّجْمُ الثَّاقِبُ | ئەستێرەی پرشنگدار و ڕووناککەرەوە ، ئەستێرەی بەرز و بڵند . |
| 4 | حَافِظٌ | چاودێر ، پارێزەر . |
| 6 | دَافِقٍ | فرێدراو بە توندی و بە خێرایی . |
| 7 | الصُّلْبِ | بڕبڕەکانی پشتی پیاو . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاقــە |
|---|---|---|
| 7 | وَٱلتَّرَآئِبِ | ئێسکەکانی سینگ و پەراسوو، ئێسکەکانی سینگی ئافرەت وشوێنی ملوانکە پێوەکردن |
| 8 | رَجْعِهِۦ | گەڕاندنەوەو زیندووکردنەوەی دوای نەمانی. |
| 9 | تُبْلَى | ئاشکرا دەکرێت . |
|  | ٱلسَّرَآئِرُ | نهێنیەکان و شاراوەکانی ناو دڵ . |
| 10 | نَاصِرٍ | سەرخەر و پشتیوان . |
| 11 | ٱلرَّجْعِ | باران، بۆیە پێی دەوترێ (رجع) چونکە دووبارەو چەند جار بەسەر زەوی دا دەبارێت و دێتەوە. |
| 12 | ٱلصَّدْعِ | درزو قلێش بۆ هاتنە دەرەوەی گژوگیای ڕووەك . |
| 13 | فَصْلٌ | جیاکەرەوە لە نێوان ڕەواو ناڕەوا . |
| 14 | بِٱلْهَزْلِ | گاڵتەو جێی یاری پێکردن . |
| 15 | يَكِيدُونَ | فێڵ دەکەن . |
|  | كَيْدًا | فێڵ و حیلەو تەڵەکە . |
| 16 | وَأَكِيدُ كَيْدًا | پاداشتیان دەدەمەوەو فێڵەکانیان هەڵدەوەشێنمەوە |
| 17 | فَمَهِّلِ | مۆڵەتیان بدەو پەلەیان لێمەکە . |
|  | رُوَيْدًۢا | کاتێکی کەم . |

منتدى إقرأ الثقافي

## سـورة الأعلى

| ئایەت | ووشە | ڕاڤـــە |
| --- | --- | --- |
| 1 | سَبِّحِ | بە پاکی و بێگەردی ستایشی بکە . |
| | ٱلۡأَعۡلَى | هەرە بەرز و بڵند . |
| 2 | خَلَقَ | هەموو شتێکی خەڵق کردووەو دروستی کردووە . |
| | فَسَوَّىٰ | ڕێك و پێکی کردووەو بە یەکسانی و بە تەواوی دروستی کردووە . |
| 3 | قَدَّرَ | ئەندازەی بۆ کێشاوە نەخشەی بۆ کێشاوە . |
| | فَهَدَىٰ | ڕێنموویی کردووە ، شارەزای ئەو شتەی کردووە کە خۆی ئارەزووی کردووە . |
| 4 | ٱلۡمَرۡعَىٰ | گژوگیا، لەوەڕگا . |
| 5 | غُثَآءً | پووش و پەڵاشی ووشك . |
| | أَحۡوَىٰ | زەردو ڕەش دوای سەوزبوونی . |
| 6 | سَنُقۡرِئُكَ | بە سەرت دا دەخوێنێتەوەو وەحی(سروشت) بۆدەنێرین |
| | فَلَا تَنسَىٰٓ | هیچ لەبیرناکەیت . |
| 8 | وَنُيَسِّرُكَ لِلۡيُسۡرَىٰ | یارمەتیت دەدەین و ڕێنمویت دەکەین بۆ ئەوڕێگەی ئاسانە لە هەموو کارو کردارێکدا. |
| 11 | ٱلۡأَشۡقَى | زۆر خراپ و تاوانبار . |
| 12 | يَصۡلَى | دەخرێتە ناوی ، دەچێتە ناوی . |
| 14 | أَفۡلَحَ | سەربەرز و سەرکەوتوو بوو ، سەرفرازبوو . |
| | تَزَكَّىٰ | خۆی پاك کردەوە لە گوناه و تاوان و سەرپێچی . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|
| 16 | تُؤۡثِرُونَ | هەڵی دەبژێرن و مەبەستانەو پێتان باشترە. |
| 18 | صُحُفِ | نامەو پەڕاوی نووسراو . |

## سـورة الغاشية

| ئایەت | ووشە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|
| 1 | ٱلۡغَٰشِيَةِ | ڕۆژی دوایی کە خەڵك دادەپۆشێت بە ناخۆشی و سەختی ڕووداوەکانی . |
| 2 | خَٰشِعَةٌ | سەر شۆڕ و ڕیسواو مل کەچ . |
| 3 | عَامِلَةٌ | هەوڵدەر ، کارکەر ، ئیشکەر . |
| | نَّاصِبَةٌ | ماندوو ، شەکەت ، ڕەنجەڕۆ . |
| 4 | تَصۡلَىٰ نَارًا حَامِيَةً | دەخرێنە ناوئاگرێکی زۆرگەرمەوە (ئەوپەڕی گەرمی) |
| 5 | عَيۡنٍ ءَانِيَةٍ | کانیاوێکی هەرە گەرم و کوڵاو . |
| 6 | ضَرِيعٍ | شتێکە لەناو دۆزەخ وەکو دڕك تاڵ و بۆگەن و ناخۆشە |
| 7 | وَلَا يُغۡنِي | هیچ سوودی نییە ، هیچ شتێ لانادات . |
| 8 | نَّاعِمَةٌ | جوان و ڕووناك و گەشاوە . |
| 9 | لِّسَعۡيِهَا رَاضِيَةٌ | لە کۆشش و هەوڵدانی دونیایان ڕازی بوونە. |
| 10 | عَالِيَةٍ | بەرزو بڵند . |
| 11 | لَٰغِيَةً | قسەی هیچ و پوچ و نابەجێ . |
| 12 | جَارِيَةٌ | ڕەوان و بەردەوام ڕۆیشتوو . |
| 13 | سُرُرٌ مَّرۡفُوعَةٌ | قەنەفەو تەختی بەرز . |
| 14 | وَأَكۡوَابٌ مَّوۡضُوعَةٌ | پەرداخی جوان و نەخشین دانراوە . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــــە |
|---|---|---|
| 15 | وَنَمَارِقُ | پشتی ، سەرین ، بالیف . |
| | مَصْفُوفَةٌ | ڕیزکراو ، لەتەنیشت یەکتر . |
| 16 | وَزَرَابِيُّ | فەرش و ڕایەخی جوان و گران بەها . |
| | مَبْثُوثَةٌ | ڕاخراو بڵاوکراو لەشوێنی دانیشتن . |
| 17 | أَفَلَا يَنظُرُونَ | وورد نابنەوەو تێنافکرن . |
| 19 | نُصِبَتْ | داکوتراو دامەزراو . |
| 20 | سُطِحَتْ | ڕاخراو تەختکراو . |
| 22 | بِمُصَيْطِرٍ | دەسەڵاتدار و توانادار . |
| 25 | إِيَابَهُمْ | گەڕانەوەیان لە دوای مردن . |

## سـورة الفجر

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــــە |
|---|---|---|
| 1 | وَالْفَجْرِ | سوێند بە کاتی بەرەبەیان . |
| 2 | وَلَيَالٍ عَشْرٍ | سوێند بە دە شەوی سەرەتای مانگی قوربان (ذي الحجة). |
| 3 | وَالشَّفْعِ | جووت ، ڕۆژی قوربانی . |
| | وَالْوَتْرِ | تاك ، ڕۆژی عەرەفە . |
| 4 | يَسْرِ | تێ دەپەڕێت و دەڕوات . |
| 5 | قَسَمٌ | سوێند خواردن . |
| | لِذِي حِجْرٍ | بۆ ئەوانەی خاوەنی عەقل و ژیریی و تێگەیشتنن |
| | حِجْرٍ | ڕێگەگرتن ، بۆیە بە عەقل دەگوترێ چونکە ڕێگری دەکات لە نەفامی و نەزانی. |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 6 | بِعَادٍ | بە (عاد)ی گەلی پێغەمبەر هود علیه السلام (ناوی باوکیان بوو) . |
| 7 | إِرَمَ | ناوی باپیریان بوو ، هۆزەکە بەم ناوە ناوبانگی دەرکردبوو . |
| | ذَاتِ ٱلْعِمَادِ | خاوەن بەژن و بالآی درێژ و بلّند ، خاوەن هێزو تواناو قەلآی سەخت و مەزن . |
| 9 | جَابُواْ ٱلصَّخْرَ | شاخ و بەردیان لێ دەتاشی و خانوویان لێدروست دەکرد . |
| | بِٱلْوَادِ | لەشیو و دۆڵەکاندا . |
| 10 | ذِى ٱلْأَوْتَادِ | خاوەن سوپا و هێزێکی زۆر ، خاوەن سنگ و مێخ کەخانووەکانیان پێدامەزراند وەکو هەڕەمەکان. |
| 11 | طَغَوْاْ | یاخی بوون و لە سنوور دەرچوون . |
| 12 | ٱلْفَسَادَ | خراپەو تاوان . |
| 13 | فَصَبَّ | دایگرتن ، بەسەری دا چەسپاندن . |
| | سَوْطَ عَذَابٍ | قامچی سزاو ئازارکێشان ، سزایەکی پڕ ئازار و ئێش |
| 14 | لَبِٱلْمِرْصَادِ | لەکەمین و بۆسەدایە و چاودێریان دەکاتن . |
| 15 | ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ | بە چاکەو نیعمەت تاقی کردەوە یان بە خراپەو ناخۆشی |
| | فَأَكْرَمَهُۥ | ڕێزی لێگرت . |
| 16 | فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ | ڕزق و ڕۆزی لێگرتەوەو کەمی پێدا . |
| | أَهَٰنَنِ | ڕیسوای کردووم و ڕێزی لێنەناوم . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاقـــە |
|---|---|---|
| 18 | وَلَا تَحَٰٓضُّونَ | هانی یەکتر نادەن . |
| 19 | ٱلتُّرَاثَ | میرات، کەلەپوور، میراتی ئافرەت و منداڵ . |
| | أَكۡلٗا لَّمّٗا | بە حەڵاڵ و حەڕامی هەمووی دەخۆن ، بە خواردنێکی زۆر و توند . |
| 20 | حُبّٗا جَمّٗا | بە خۆشەویستیەکی زۆر ، بە خۆشەویستیەکی زۆر و سووربوون لەسەری. |
| 21 | دُكَّتِ ٱلۡأَرۡضُ | زەوی درابەیەکدا و بە بومەلەرزە لەت و شەق بوو . |
| | دَكّٗا دَكّٗا | پارچە پارچەو یەك لەدوای یەك تاوەکو وورد و خاشبوو . |
| 22 | وَٱلۡمَلَكُ | فریشتەکان . |
| | صَفّٗا صَفّٗا | پۆل پۆل و ڕیز ڕیز . |
| 23 | وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكۡرَىٰ | ئەم بیرکەوتنەوەیە هیچ سوودێکی پێناگەیەنێت . |
| 26 | وَلَا يُوثِقُ | کەلەپچەو کۆت ناکرێت بە زنجیر |
| 27 | ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ | ئارامەو دڵنیایە لە پاداشت وەرگرتن . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | راڤــە |
|---|---|---|
| | **سـورة البلد** | |
| 1 | لَآ أُقۡسِمُ | سوێند دەخۆم . |
| | بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ | بەم شارە (شاری مەککەی پیرۆز ) . |
| 2 | وَأَنتَ حِلُّۢ | نیشتەجێی تیایدا ، تۆ بۆت حەڵاڵ کراوە کە تیایدا چی دەکەیت . |
| 3 | وَوَالِدٖ وَمَا وَلَدَ | سوێند بەباوك وئەوەی لێیبوونە(لەئادەم ونەوەکانی) |
| 4 | كَبَدٍ | ڕەنج و کێشەو ناڕەحەتی و ناخۆشی . |
| 6 | لُّبَدًا | زۆر بەخشینەو زۆر سەرفکردن . |
| 10 | ٱلنَّجۡدَيۡنِ | دوو ڕێگا ، ڕێگای چاکەو خراپە |
| 11 | فَلَا ٱقۡتَحَمَ ٱلۡعَقَبَةَ | کەچی پەلاماری پلەی سەختی نەداوە و بەرەو چاکەی گەورە نەچووە . |
| 12 | ٱلۡعَقَبَةُ | ڕێگەی سەخت و ناخۆشی . |
| 13 | فَكُّ رَقَبَةٍ | ئازادکردنی کۆیلەیە (بەندە) . |
| 14 | ذِي مَسۡغَبَةٖ | ڕۆژی گرانی برسیەتی و ماندووبوون . |
| 15 | ذَا مَقۡرَبَةٍ | خاوەنی نزیکیتی و خزمایەتی . |
| 16 | ذَا مَتۡرَبَةٖ | بەخاك نووساو دانیشتوو و پەککەوتەو خاوەن هەژاریەکی زۆر سەخت . |
| 17 | وَتَوَاصَوۡاْ | ئامۆژگاری یەکتریان کردووە . |
| | بِٱلۡمَرۡحَمَةِ | بە بەزەیی و ڕەحمەت میهرەبانی . |
| 18 | ٱلۡمَيۡمَنَةِ | دەستی ڕاست ، چاك . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــــە |
|---|---|---|
| 19 | ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ | دەستی چەپ ، خراپ . |
| 20 | مُّؤۡصَدَةُۢ | لەسەریەك. |

## ســورة الشمس

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــــە |
|---|---|---|
| 1 | وَٱلشَّمۡسِ | سوێند بە خۆر (ڕۆژ) . |
|  | وَضُحَىٰهَا | بە ڕووناکی و تیشکی خۆر ، تیشکی خۆر دوای خۆرهەڵاتن . |
| 2 | تَلَىٰهَا | بەدوای دادێت لەدوای خۆرئاوابوون . |
| 3 | جَلَّىٰهَا | بەدەردەکەوێت و ئاشکراو ڕوون و دیاردەبێت . |
| 4 | يَغۡشَىٰهَا | دای دەپۆشێت،خۆر دادەپۆشێت بە تاریکی |
| 5 | وَمَا بَنَىٰهَا | وە ئەوەی دروستی کردووە (کە خوایە) جل جلالە . |
| 6 | وَمَا طَحَىٰهَا | وەلەوەی ڕایخستوەوگونجاندوویەتی بۆژیان |
| 7 | وَمَا سَوَّىٰهَا | وە ئەوەی بە ڕێك و پێکی ئەندازەی کێشاوە و دروستی کردووە . |
| 8 | فُجُورَهَا | خراپەو تاوان و سەرپێچیەکان ، بەدکاری . |
|  | وَتَقۡوَىٰهَا | لەخێرو چاکەو پارێزکاری . |
| 9 | أَفۡلَحَ | سەربەرز و سەرکەوتوو بووە . |
|  | مَن زَكَّىٰهَا | ئەوەی پاکی کردۆتەوە و گەشەی پێدراوە بە تەقواو لە خوا ترسان . |
| 10 | وَقَدۡ خَابَ | بەڕاستی زەرەرمەند و نائومێدبووە. |
|  | دَسَّىٰهَا | وونی کردووەو شاردویەتیەوە بە گوناھ و تاوان . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 11 | بِطَغْوَىٰهَآ | بەهۆی سەرکەشی و سەرپێچی و لە سنوور دەرچوونیان . |
| 12 | ٱنۢبَعَثَ | هەڵسا و بە پەلە هەوڵی دا . |
| | أَشْقَىٰهَا | خراپترین و بەدترین کەس . |
| 13 | نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقْيَٰهَا | تکادەکەم وازبێنن و دوورکەونەوە لە ووشترەکەو ئاوەکە |
| 14 | فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ | سزای ڕشت بەسەریاندا ، چین لەسەرچین زەوی خستنە سەرو سزای خستنە سەر . |
| | فَسَوَّىٰهَا | تەخت و یەکسانی کردن لەگەڵ زەوی . |
| 15 | عُقْبَٰهَا | سزاو تۆڵە سەندنەوەی دواڕۆژ ، سزای پاشەڕۆژ . |

## سـورة اللیل

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 1 | يَغْشَىٰ | دای دەپۆشێ بەتاریکیەکەی . |
| 2 | تَجَلَّىٰ | بەڕووناکی وتیشکەکەیەوە، دەرکەوت و ڕوون بوویەوە |
| 4 | سَعْيَكُمْ | هەوڵ و کۆششتان . |
| | لَشَتَّىٰ | جۆراو جۆر و جیاوازە لە پاداشت . |
| 6 | وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ | باوەڕی بەو شتە هێنا کە زۆر چاکە کە ئەویش ووشەی (لا اله الا الله ) یەکتاپەرستیە ، یان بەهەشت ، ئاینی زۆر چاك کە ئیسلامە . |
| 7 | يَتَزَكَّىٰ | یارمەتی دەدەین و ئامادەی دەکەین . |
| | لِلْيُسْرَىٰ | بۆ ئەو ڕێیەی کە ئاسانەو سەردەکێشێت بۆ ئاسانی و خۆشی و حەسانەوە. |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 8 | وَٱسْتَغْنَىٰ | خۆی بێ نیاز زانی و خۆی بە گەورە زانی . |
| 10 | لِلْعُسْرَىٰ | بۆ ئەو ڕێیەی کە سەختەو ناخۆشە کە دۆزەخە . |
| 11 | وَمَا يُغْنِى | هیچ سوودی پێناگەیەنێت ، قازانجی پێناگەیەنێت . |
| | تَرَدَّىٰٓ | تیاچوو ، لەناوچوو ، کەوتە ناو ئاگری دۆزەخەوە . |
| 12 | إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ | لەسەر ئێمەیە ئاماژەکردن بۆ ڕێنمونی و هیدایەت . |
| 14 | تَلَظَّىٰ | بڵێسەدار و گڕگرتوو . |
| 15 | لَا يَصْلَىٰهَآ | ناخرێتە ناوی ، ناخۆشیەکەی ناچێژێ . |
| | ٱلْأَشْقَى | خراپترین کەس ، کافر و بێ بڕوا . |
| 17 | وَسَيُجَنَّبُهَا | دووردەخرێتەوە لێی . |
| | ٱلْأَتْقَى | پارێزگارترین و چاکترین کەس . |
| 18 | يَتَزَكَّىٰ | خۆی لێ پاك دەکاتەوە لە خراپەو تاوان. |
| 19 | تُجْزَىٰٓ | پاداشت بدرێتەوە و خەڵات بکرێت . |
| 20 | ٱلْأَعْلَىٰ | هەرە بەرز و بڵند . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|

## ســورة الضحى

| ئایەت | ووشە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|
| 1 | وَٱلضُّحَىٰ | سوێند بە چێشتەنگاو ( کاتی بەرزبوونەوەی خۆر لە بەیانیان ) . |
| 2 | سَجَىٰ | تاریکیەکەی توندبوو و زەوی داپۆشت ، ئارام بویەو پەروەردگارت . |
| 3 | مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ | وازی لێنەهێناویت و بەجێی نەهێشتوی . |
| | وَمَا قَلَىٰ | لێت توورەنەبوەو خەشمی لێ نەگرتوویت . |
| 6 | أَلَمْ يَجِدْكَ | ئایا فێری نەکردوویت . |
| | يَتِيمًا | بەهەتیوی (بە منالی بێ باوك بویت) . |
| | فَـَٔاوَىٰ | حەواندیتیەوەو بەخێوی کردووی . |
| 7 | ضَآلًّا | سەر لێشێواو نەزان بە حەلاڵ و حەڕام ، بێ ئاگاو نەزان بە شەریعەت . |
| | فَهَدَىٰ | ڕێنمونی کردی بە سروش (وەحی) . |
| 8 | عَآئِلًا | هەژار و نەدار . |
| | فَأَغْنَىٰ | دەوڵمەندی کردویت و قەناعەتی پێبەخشیویت . |
| 9 | فَلَا تَقْهَرْ | مەچەوسێنەرەوەو دڵی مەڕەنجێنە . |
| 10 | فَلَا تَنْهَرْ | هەڵمەشاخێ ، بەتووڕەیی وەڵامی مەدەرەوەو تێی هەڵمەشاخێ . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|

## ســورة الشرح

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 1 | أَلَمْ نَشْرَحْ | ئایا ئاسوودەمان نەکردیت بە دانایی و پێغەمبەرایەتی . |
| 2 | وَوَضَعْنَا عَنكَ | دامان گرت لێت و لامان برد . |
| | وِزْرَكَ | باری گران (قورسایی پێغەمبەرێتی و پەیامەکەی) . |
| 3 | أَنقَضَ ظَهْرَكَ | قورسایی خستبووە سەرپشت و ماندوو هیلاکی کردبوو . |
| 4 | ذِكْرَكَ | ناو و ناوبانگ . |
| 7 | فَرَغْتَ | لە خوا پەرستی بوویەوە ، لە جیهاد و تێکۆشان بوویەوە . |
| 7 | فَانصَبْ | هەوڵ و کۆشش بکەو ماندووببەو کارێکی تر بەدوای دا بێنە . |
| 8 | فَارْغَبْ | حەزو ئارەزوت بۆ خوابێ و هەر بۆ ڕەزامەندی ئەو بێت . |

## ســورة التين

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 1 | وَالتِّينِ | سوێند بە هەنجیر . |
| 2 | وَطُورِ | کێوی تور(خوا گفتو گۆی لەگەڵ پێغەمبەر موسا کرد لەوێدا) . |
| | سِينِينَ | پیرۆز وموبارەك،واتە سەینا ناوی شوێنێکە |
| 3 | الْبَلَدِ الْأَمِينِ | شاری ئارام و بێترس(شاری مەککەی پیرۆز) |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 4 | أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ | بەجوانترین و چاکترین شێوەو ئەندازە بۆ کێشان . |
| 5 | رَدَدۡنَٰهُ | نزمی دەکەینەوەو دەیخەینە ناوی . |
| | أَسۡفَلَ سَٰفِلِينَ | شوێنی هەرە نزم و ناخۆش (دۆزەخ) ، پیروپەککەوتەیی . |
| 6 | غَيۡرُ مَمۡنُونٖ | نەبڕاوەو بێکۆتا . |
| 7 | بِٱلدِّينِ | بە ڕۆژی دوایی و پاداشت و سزا ، ڕۆژی زیندوبونەوە . |

سـورة العلق

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 2 | عَلَقٍ | خوێنێکی بەستووی هەڵواسراو بەدیواری منداڵدان (ڕەحم). |
| 4 | عَلَّمَ | فێری کردووە بەوەی بەقەڵەم بنوسێت و ئیش و کارەکانی تۆمار بکات . |
| 6 | لَيَطۡغَىٰٓ | یاخی دەبێت و سنور دەبەزێنێت لە خراپەکاری دا . |
| 7 | ٱسۡتَغۡنَىٰٓ | دەوڵەمەند بووەو بێ نیازبووە . |
| 8 | ٱلرُّجۡعَىٰٓ | گەڕانەوە ، سەرەنجام . |
| 9 | أَرَءَيۡتَ | هەواڵم پێبدە ، پێم ڕابگەیەنە . |
| 15 | لَنَسۡفَعَۢا | ڕای دەکێشین زۆر بەتوندی و بە هێز . |
| | بِٱلنَّاصِيَةِ | بەقژی پێشەوەی سەری . |
| 17 | فَلۡيَدۡعُ نَادِيَهُۥ | بانگی هاوڕێ و هاومەجلیس و گەل و هۆزی بکات . |
| 18 | ٱلزَّبَانِيَةَ | فریشتەی زەبر بەدەست و بەتوانای بەر دەرگای جەهەننەم . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئايەت | ووشە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|

## سـورة القدر

| ئايەت | ووشە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|
| 1 | أَنزَلْنَٰهُ | دامان بەزاندووەو نازڵمان کردووە . |
| | لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ | شەوی بەڕێز و گەورەو بەفەڕ ( شەوێکە لە شەوەکانی مانگی ڕەمەزان). |
| 4 | وَٱلرُّوحُ | جوبریل (علیه السلام) . |
| | مِّن كُلِّ أَمْرٍ | بە هەموو کارێکی خێر و بە فەڕو بەرەکەت. |
| 5 | سَلَٰمٌ هِيَ | هێمن و ئاسایشی و ئاسوودەیە . |

## سـورة البينة

| ئايەت | ووشە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|
| 1 | مُنفَكِّينَ | وازیان لێهێناو دەستیان هەڵگرت . |
| | ٱلْبَيِّنَةُ | نیشانە وبەڵگەی ڕوون و ئاشکرا(هاتنی پێغەمبەرێك) |
| 2 | صُحُفًا | پەڕاوێك کەقورئانی لەسەر نوسراوە . |
| | مُّطَهَّرَةً | پاك و خاوێن و دوور لە ناڕەوایی و شوبهە . |
| 3 | فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ | تیایدایە چەند نوسراو فەرمان و حوکمێکی ڕاست و دروست . |
| 4 | وَمَا تَفَرَّقَ | وە جیابوونەوەو دوبەرەکی کەوتە نێوانیان. |
| 5 | ٱلدِّينَ | پەرستش ، پەرستن . |
| | حُنَفَآءَ | لادراو لە ناڕەوا بەرەو ئاینی ڕاست و دروست . |
| | دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ | ئایینی ڕاست و دروست . |
| 6 | ٱلْبَرِيَّةِ | دروستکراوەکان ، مرۆڤەکان . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|

## سـورة الزلزلة

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 1 | زُلْزِلَتِ | لەرزی و جولا بە جولانێکی توند و خێرا ، هاتە لەرزین و هەژاندن . |
| 2 | أَثْقَالَهَا | شتی قورس و گرانی ناخی زەوی لە مردووەکان کانزاکاندا ...هتد . |
| 4 | تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا | هەواڵی ڕووداوەکانی دەگێڕێتەوە کە لەسەری ئەنجامدراوە . |
| 5 | أَوْحَىٰ لَهَا | سروشی بۆ کردووەو پێی ڕاگەیاندووە . |
| 6 | يَصْدُرُ النَّاسُ | خەڵکی دەردەچن و دەڕۆن . |
| | أَشْتَاتًا | جیا جیا بەپێی حاڵ و کردەوەکانیان ، پەرش و بڵاوو جیا جیا . |
| 7 | مِثْقَالَ ذَرَّةٍ | بەقەد کێشی بچوکترین شت (ووردیلەیەك) ، تۆسقاڵێك . |

## سـورة العاديات

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 1 | وَالْعَادِيَاتِ | ئەسپی تاودەرو خێرا ، ئەو ئەسپانەی کە بۆ جیهادو تێکۆشان دەردەچن . |
| | ضَبْحًا | نرکەو ناڵەو حیلەیان دێت کە ڕادەکە |
| 2 | فَالْمُورِيَاتِ | ئەو ئەسپانەی بە ناڵی پێیان ئاگـر دەکەنەوەو بریسکــــە دردەچێت لە ژێر پێیان. |
| | قَدْحًا | ئاگرو بریسك . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشـە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|
| 3 | فَٱلۡمُغِيرَٰتِ | هێرشبەران و هەڵدەکوتنە سەر ئۆردوگای دوژمنان . |
| | صُبۡحٗا | بەکاتی بەیانی ، دەمەو بەیان . |
| 4 | فَأَثَرۡنَ بِهِۦ | بەرپای دەکەن و دروستی دەکەن ، شوێن پێ هەڵدەستێنن . |
| | نَقۡعٗا | تۆز و خۆڵ و غوبار ، تەپ و تۆز . |
| 5 | فَوَسَطۡنَ بِهِۦ جَمۡعًا | خۆیان دەکەن بە ناوەڕاستی دوژمندا . |
| 6 | لَكَنُودٞ | ناسوپاسگوزار و بێباوەڕ بەنازو نیعمەتەکانی خودا ، نکۆڵی نیعمەتەکانی خوا دەکات. |
| 8 | وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلۡخَيۡرِ لَشَدِيدٌ | بۆ خۆشەویستی ماڵ و پولی دونیا زۆر بگیرەو سورە . |
| 9 | بُعۡثِرَ | هەڵگەڕانەوەو هاتنە دەرەوەو بڵاوبوونەوە . |
| 10 | وَحُصِّلَ | کۆکرایەوەو دەرکەوت ، جیاکرایەوە . |

## سـورة القارعة

| ئایەت | ووشـە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|
| 1 | ٱلۡقَارِعَةُ | ڕۆژی دوایی کە لەدڵەکان دەدات و ڕایان دەچڵەکێنێت و دەیان لەرزێنێت بە کارەساتە ناخۆشەکانی |
| 4 | كَٱلۡفَرَاشِ | وەکو پەپولە . |
| | ٱلۡمَبۡثُوثِ | پەراگەندەو پەرش و بڵاوبووەوە . |
| 5 | كَٱلۡعِهۡنِ | وەکو خوری و سوفی ڕەنگا و ڕەنگی جیاواز . |
| | ٱلۡمَنفُوشِ | شیکراوەو جیاکراوە بە پەنجە. |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | راڤــە |
| --- | --- | --- |
| 6 | ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ | تەرازووی خێری قورس و گران بێت . |
| 9 | فَأُمُّهُۥ | جێگاو شوێنی مانەوەی . |
| | هَاوِيَةٞ | دۆزەخ ، جەهەننەم کە تێیدا دەخولێتەوە و دەخرێتە خوارەوە . |
| 10 | مَا هِيَهۡ | چیە ئەو شتە ؟ |
| 11 | حَامِيَةُۢ | هەڵگیرساو و سوتێنەرو بڵێسەدار . |

## سورة التكاثر

| ئایەت | ووشە | راڤــە |
| --- | --- | --- |
| 1 | أَلۡهَىٰكُمُ | خەریکی کردوون و بێ ئاگایی کردوون ، مەشغوڵی کردوون. |
| | ٱلتَّكَاثُرُ | شانازی کردن بە زۆری سەروەت و سامانی دونیا . |
| 2 | زُرۡتُمُ | مردن و چوون بۆ لای . |
| | ٱلۡمَقَابِرَ | گۆڕ و گۆڕستان . |
| 5 | عِلۡمَ ٱلۡيَقِينِ | بە دڵنایی یەوەو بە زانینێکی تەواو . |
| 7 | عَيۡنَ ٱلۡيَقِينِ | بەدڵنیایی بە چاوی ڕاستەقینە (بە بینین) . |
| 8 | ٱلنَّعِيمِ | بەهرەو نازونیعمەت . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|

## سـورة العصر

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 1 | وَٱلۡعَصۡرِ | سوێند بە زەمەن (کات) ، کاتی نوێژی عەصر ، کۆتایی ڕۆژ . |
| 2 | لَفِي خُسۡرٍ | لەخەسارەتمەندی و زیان و زەرەردان . |
| 3 | وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ | ئامۆژگاری یەکتریانکردووە بە پابەندبوون بە هەق و ڕاستی و چاکە . |
| | وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ | ئامۆژگاری یەکتریانکردووە بە سەبرو ئارامگرتن لەسەر پەرستش وتاقی کردنەوەکان. |

## سـورة الهمزة

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 1 | وَيۡلٌ | سزاو لەناوچوون ، دۆڵێکە لەدۆزەخ . |
| | هُمَزَةٍ | عەیب گرو غەیبەتکارو بەخراپە باسی خەڵکی کا . |
| | لُّمَزَةٍ | عەیب و عار لەخەڵك دەگرێت و بە برۆ و چاوی ئاماژەیان بۆ دەکات بە گاڵتە . |
| 2 | وَعَدَّدَهُۥ | کۆی کردۆتەوەو ئاماری کردووە ، هەڵی گرتووە وەکو زەخیرە . |
| 3 | أَخۡلَدَهُۥ | دەیهێڵێتەوەو نەمری دەکات لە دونیا . |
| 4 | لَيُنۢبَذَنَّ | بەڕاستی فڕێ دەدرێتە ناوی ، دەخرێتە ناوی . |
| 5 | ٱلۡحُطَمَةِ | ئاگری دۆزەخ کە هەموو شتێك تێك دەشکێنێت و ووردی دەکات . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|
| 6 | ٱلْمُوقَدَةُ | هەڵگیرساو و داگیرساو بڵێسەدار . |
| 7 | تَطَّلِعُ | دێت بەسەری داو پێی دەگات . |
| | ٱلْأَفْـِٔدَةِ | دڵەکان . |
| 8 | مُّؤْصَدَةٌ | سەرگیراو دەرگا داخراو ، دەرگا داخراو . |
| 9 | عَمَدٍ | کۆت و ستون . |
| | مُّمَدَّدَةِۭ | درێژکراو ڕاکشاو . |

## سـورة الفيل

| ئایەت | ووشە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|
| 1 | بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ | خاوەن فیلەکان ، ئەبرەهەو سوپاکەی . |
| 2 | كَيْدَهُمْ | فڕوفێڵەکانیان بۆ ڕوخاندنی کەعبە . |
| | تَضْلِيلٍ | پووچ بوونەوەو تێکچوون و هەڵوەشانەوە . |
| 3 | أَبَابِيلَ | پۆل پۆل ، کۆمەڵ کۆمەڵ بەدوای یەکتردا . |
| 4 | تَرْمِيهِم | بەردبارانیان دەکات . |
| | سِجِّيلٍ | قوڕێکی ڕەقە سورکراوە ، ووردە بەردی وەکو خشتی سورکراوە . |
| 5 | كَعَصْفٍ | وەکو پووش و پەڵاش و کا . |
| | مَّأْكُولٍۭ | خوراو . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاقــە |
|---|---|---|

## سـورة قريش

| ئایەت | ووشە | ڕاقــە |
|---|---|---|
| 1 | لِإِيلَـٰفِ | هۆگری و خۆشەویستی بۆ شتێك . |
| 2 | رِحۡلَةَ ٱلشِّتَآءِ | هاتوو چۆو کاروانی زستانەیان . |
| 4 | جُوعٖ | برسێتی . |

## سـورة الماعون

| ئایەت | ووشە | ڕاقــە |
|---|---|---|
| 1 | أَرَءَيۡتَ | هەواڵم پێبدەو پێم ڕابگەیەنە . |
| | يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ | نکۆڵی لە ئایین و پاداشتی دوا ڕۆژدەکات . |
| 2 | يَدُعُّ | پاڵی پێوەدەنێت و پیایدا هەڵدەشاخێت ، بە توندی پاڵی پێوەدەنێت . |
| 3 | وَلَا يَحُضُّ | هانی خەڵکی نادات و لایان خۆشەویست ناکات . |
| 4 | فَوَيۡلٞ | ئێش و هاوار و ئازار و تیاچوون ، دۆڵێکە لە دۆزەخ . |
| 5 | سَاهُونَ | بێ ئاگاو گوێی پێنادەن . |
| 6 | يُرَآءُونَ | بەڕوپاماییی و بە ڕیابازی ، بەڕووکەشی و لەبەر خەڵك |
| 7 | ٱلۡمَاعُونَ | چاکەو کۆمەکی بچوك ، (ماعون) بە هەمو شتێك دەوترێ کە خێرو چاکەی تێدابێت وەکو قاپ و قاچاغ کەخۆراك و خواردنی تێدایە. |

منتدى إقرأ الثقافي

## سـورة الكوثر

| ئایەت | ووشە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|
| 1 | ٱلْكَوْثَرَ | خێرو چاکەی زۆر و بەفەر (ڕووبارێکە لە بەهەشت). |
| 2 | وَٱنْحَرْ | قوربانی سەربڕە . |
| 3 | شَانِئَكَ | ناحەزو ئەو کەسەی ڕقی لەتۆ دەبێتەوە ، دوژمن و ناحەزانت . |
| | ٱلْأَبْتَرُ | دوا بڕاو و وەجاخ کوێر. |

## سـورة الكافرون

| ئایەت | ووشە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|
| 6 | لَكُمْ دِينُكُمْ | بۆ ئێوەیە سزای شیرك و بێباوەڕ بونتان . |
| | وَلِيَ دِينِ | یەکتاپەرستی و دڵسۆزی و پاداشتەکەی بۆ خۆمە . |

## سـورة النصر

| ئایەت | ووشە | ڕاڤـــە |
|---|---|---|
| 1 | نَصْرُ ٱللَّهِ | یارمەتی و کۆمەك، سەرکەوتنی خوا . |
| | وَٱلْفَتْحُ | سەرکەوتن و ڕزگارکردنی شاری مەککە . |
| 2 | أَفْوَاجًا | پۆل پۆل و کۆمەڵی زۆر . |
| 3 | فَسَبِّحْ | بە پاك و پیرۆزی ڕابگرە . |
| | تَوَّابًا | زۆر گیراکەری تۆبەکردن و پەشیمان بوونەوەی بەندەکانیەتی . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|

## ســورة المسد

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 1 | تَبَّتۡ | لەناوچوو ، خەسارەتمەندوو تیاچوو . |
| 2 | مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ | سوودی پێنەگەیاند و فریای نەکەوت . |
| 3 | سَيَصۡلَىٰ نَارٗا | دەخرێتە ناو ئاگرێکەوە ، گەرمی و ناخۆشی ئاگر دەچێژێت . |
| | ذَاتَ لَهَبٖ | بڵسەدار ، سوتێنەر و بڵێس هاوێژ . |
| 4 | حَمَّالَةَ | هەڵگرو کۆکەرەوە . |
| 5 | فِي جِيدِهَا | لە گەردەنیدا ، لە ملی دا . |
| | مَّسَدِۭ | پەت ، گوریسێکی چنراو ، گوریسێکی بادراو . |

## ســورة الإخلاص

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 1 | أَحَدٌ | تاك و تەنها . |
| 2 | ٱلصَّمَدُ | بەتەنها جێی نازو ئومێدە بۆ ئەنجامدانی پێداویستیەکان . |
| 4 | كُفُوًا | هاوشێوەو هاوتا . |

## ســورة الفلق

| ئایەت | ووشە | ڕاڤــە |
|---|---|---|
| 1 | أَعُوذُ | پەنا دەگرم و خۆم دەپارێزم ، پشتی پێدەبەستم . |
| | ٱلۡفَلَقِ | بەرەبەیان ، بەیانی ، خەڵق و دروستکراوەکان . |
| 3 | غَاسِقٍ | شەوی زۆر تاریك ، سەرەتای تاریکی شەو . |

منتدى إقرأ الثقافي

| ئایەت | ووشە | راڤــە |
|---|---|---|
| 3 | وَقَبَ | تاریکی دابێت ، بێتە ناو تاریکیەوە ، تاریکیەکەی هەموو شوێنێکی داگرت. |
| 4 | ٱلنَّفَّٰثَٰتِ | ژنانی جادووگەری فووکەر بە گرێیەکان . |
| | ٱلْعُقَدِ | گرێیەکان . |
| 5 | حَاسِدٍ | بەخیل و حەسوود . |

## سورة الناس

| ئایەت | ووشە | راڤــە |
|---|---|---|
| 1 | بِرَبِّ | بە پەروەردگارو دروستکەری خەڵك . |
| 2 | مَلِكِ | پادشاو خاوەن . |
| 3 | إِلَٰهِ | پەرستراو ، خودا . |
| 4 | ٱلْوَسْوَاسِ | وەسوەسە پەیداکەر ، خەیاڵ و خەتەرە پەیداکەر . |
| | ٱلْخَنَّاسِ | خۆ پەنهاندەر ، خۆشاراوەو نادیار . |
| 6 | ٱلْجِنَّةِ | جنۆکە ، پەری . |

منتدى إقرأ الثقافي